# هۆکارەکانی ڕەفتاری تاوانکاری



ئامادەکردنی مافپەروەر
سەردار عەزیز خۆشناو

کوردستان - ٢٠٠٠

# هۆکارەکانی ڕەفتاری تاوانکاری

ئامادەکردنی مافپەروەر
سەردار عەزیز خۆشناو

هەولێر _ ٢٠٠٠

ناوی نامیلکە: هۆکارەکانی رەفتاری تاوانکاری

ئامادەکردن: سەردار عەزیز خۆشناو

تیراژ: ٤٠٠ دانە

کۆمپیوتەر: یەکێتی ماف پەروەرانی کوردستان

نەخشەسازی و پیت چنین: وریا صابر أمین

ژمارەی سپاردن: ( ٢١٢ ) ساڵی ١٩٩٩

هەولێر _ کوردستان ٢٠٠٠

شوێنی چاپکردن: چاپخانەی ماردین

# سەرەتا

هەڵس و کەوتی تاوانکاری ئەو دیاردە کۆمەڵایەتیە ترسناکەیە شیرازەی کۆمەڵگا تێك دەدات و بڵاوبوونەوەی گرفتێکی گەورەیە لەبەردەم سەرکەوتنی دەسەڵاتی سیاسی لە ئیش و کارەکانیدا، هەر لەسەرەتای سەدەی نۆزدەوە هەوڵەکان بۆ کەم کردنەوەو بن بڕکردنی کاریگەری ئەم هۆکارو فاکتەرانەی دەبنە ڕێخۆشکەر بۆ ئەنجام دانی لەزیادبوون دایەو پسپۆڕو زانایانی ئەم بوارە بە هاوکاری لەگەڵ پسپۆڕو زانایانی زانستی کۆمەڵایەتی گۆڕانکارییێکی پراکتیکیان لە جۆرو شێوازی مامەڵە لەگەڵ ئەنجام دەرانی ئەم دیاردەیە هێناکایەوە و ژمارەیێکی زۆری کۆنگرەو کۆبوونەوەکانی نێودەوڵەتی لەبەرچاویان گرتوو، دەستوورو یاسا ناوخۆیەکان لە دەقەکانیاندا ڕەنگی دایەوە، دواتر زۆربەی وڵاتان لە ڕێگای وەزارەتەکانی تایبەت بەکاروباری کۆمەڵایەتی بایەخێکی زۆریان بەم بوارەدا بە دانانی بەرنامەییێکی کورت ودرێژخایەن، ئەم بابەتە گرنگە کە ڕەفتاری تاوانکاری و هۆکارو فاکتەرو دۆزینەوەی باشترین ڕێگا چارەکان بۆ بن بڕکردنی زۆر هەڵدەگرێت و هەریەك لە هۆکارەکانی بابەتی توێژینەوەییێکی سەربەخۆن، لێرەدا بە

کورتی هەوڵ دەدەین پولێنی هۆکارو فاکتەرەکانی بکەین لە ڕووی پەیوەندی بە ژینگەی تاکە کەسی و ئەوانەی پەیوەندیان بەخودی ئەو کەسەوە هەیە، بەو ئاراتەی هەر یەکیان ببێتە توێژینەوەیێکی مەیدانی پراکتیکی لەهەرێمی کوردستان لەلایەن توێژەرو پەیوەستداراندا.

لەم ڕوانگەوە پێویستە بە کورتی باسی یەکێك لە پێناسەکانی ڕەفتاری تاوانکاری بکەین:

دیاردەییێکی کۆمەڵایەتی ترسناکە بەردەوام کۆمەڵ هەوڵ قەلاچۆکردنی داوە و هەمیشە هەوڵی داوە ڕێگە لە بڵاوبوونەوەی بگرێت.

ئەو هۆکارانەی دەبنە هۆی سەرهەڵدانی ئەم دیاردە ترسناکە یاخود یارمەتی دەرکەوتنی دەدات دوو جۆرە: هۆکاری ناوەوە (داخلی) و هۆکارەکانی دەرەوە (خارجی)، هۆکارەکانی ناوەوە ئەو هۆکارانەن کە پەیوەندی بە خودی تاوانبارەوە هەیە، بەلام هۆکارەکانی دەرەوە ئەو هۆکارانەن کە پەیوەندی بەو دەورووبەرە هەیە کە تاوانبار تیایدا دەژێت. ئەو هۆکارانەش ڕۆڵێکی گرنگیان هەیە لە کارکردنە سەر مرۆڤ بۆ ئەوەی بەلای چاکەو ڕەوشتی باش یاخود بەلای خراپە و تاوانکاری‌دا بڕوات بە تایبەتی لە قۆناغی منالیدا لەبەر

ئەوەی منالْ ئامادەیی ئەوەی هەیە باش بێت یاخود خراپ خوای گەورە دەفەرمووێت:

﴿ وَنَفسٍ وَمَا سوَّاها فَأَلهَمَهَا فُجُورَها وَ تَقواها * قَد أَفلَحَ مَن زَكَّاها * وقد خاب من دسَّاهَا﴾ سورة الشمس اية ٧_١٠.

واتە: (سوێند بە نەفس و ئەو کەسەی چاك و بەتەکوز ئەوی سازدا جا چاکەو خراپەکەیشی پێ ئیلهام کردووە. بەهەقیقەت هەر کەس نەفسی پاك کردەوە رزگاری دەبێ وە هەر کەس کەنەفسی خۆی بە گوناح ئالْوودە کرد بێ هیوا و بێبەش بوو). لێرەشدا دەوری ئەو هۆکارانە دەردەکەوێت لە چەسپاندنی باشە و لایەنی چاکە لە دەروونی منالْدا یاخود چەسپاندنی لایەنی خراپەو شەڕخوازی لە دەروونی منالْدا، ئەوەی شایەنی باسە هەردوو سەدەی (١٩،٢٠) فراوانترین و قولْترین لێکۆلْینەوەیان لەبارەی تاوانەوە تیادا کراوە.

مەبەستی ئەم لێکۆلْینەوانەش دۆزینەوەی یاساکانی پەیوەندی نێوان تاوان و توخمە جیاجیاکانی ژینگەی کۆمەلاْیەتی بوون وەك بارودۆخی ئابووری و پەروەردەو فێربوون، ئامرازەکانی راگەیاندن...

# هۆكارە دەرەكييەكان

بريتين لەم هۆكارانەی خوارەوە:

١_ ژينگەی خێزان.

٢_ ژينگەی قوتابخانە.

٣_ ژينگەی كار.

٤_ بارودۆخی ئابووری.

٥_ راگەياندن.

٦_ نەخوێندەواری.

## ا) ژینگەی خێزان

خێزان کۆمەڵێکن لە تاکە کەسان چەندین پەیوەندی بەهێز بەیەکیانەوە دەبەستێتەوە لە یەك خانوو یا زیاتر دەژین. پەیوەندی کۆمەڵایەتی پتەویان لە نێوان دایە لەسەر بنچینەی بەرژەوەندی و ئامانجی هاوبەش لەگەڵ یەکن، ئەندامەکانی پێك دێن لە دایك و باوك و منداڵەکان.

خێزان هۆکارێکی گرنگە لە پێگەیاندنی تاکەکەس لەبەر ئەوەی ئەو ژینگەیە لەسەرەتایی ژیانەوە ئەم مرۆڤە لەخۆ دەگرێت و یەکەم هۆکاری یەکسەرە کار لە منداڵ دەکات، ئەگەر خێزانەکە ژینگەیێکی خراپ بێت بە ناچارەکی بەرووبوومەکەی خراپ دەبێت، خێزان هۆکارێکی دوو سەرەیە ئەگەر باش بێت بەرهەمەکەی باش دەبێت و ئەگەر خراپ بێت بەرهەمەکەی خراپ دەبێت، لە هۆکارە نالەبارەکانی خێزان لەبەر یەك هەڵوەشانەوە، پەرت و بڵاوی ئەندامەکانی، کێشەو ناکۆکی دایك و باوك .... کە زۆر خراپ کار دەکەنە سەر دەروونی منداڵەکانی بە تایبەتی ئەگەر لێك جیابوونەوە (طلاق)ی بەدوادا بێت یاخود دوورکەوتنەوەی دایك لە ماڵەوە بۆ ماوەێکی زۆر هەتا ئەگەر بۆ پەیداکردنی بژێویش بێت

یاخود منالْ زۆری بە جۆرێك کە دایك و باوك نەپرژێنە سەر پەروەردەکردنیان بە شێوەیەکی چاك، هەروەها چەندین هۆکاری تریش لە ئارادایە کە ئەو هۆکارە نالەبارانە وا دەکەن منالْ رِکی لە ماڵەوە ببێتەوەو هەست بەبێبەش بوون بکات و هەولْ بدات لە ماڵەوە هەلْ بێت بە دوای سۆزو بایەخ پێدان بگەرێ لەدەرەوەی خێزان، ئەم هۆکارانەی باس کران وا لەمنالْ دەکەن بەرەو دەرۆزەو دزی و کاری توندوتیژیو گوێنەدان بەیاسا بچێت، هەمدیس کەسانێکی بێویژدان ئەم هەلەی دوورکەوتنەوەی منالْ لەماڵەوە دەقۆزنەوەو سوودیان لێوەردەگرن کاتێك کاری خراپیان پێئەنجام دەدەن لە دزیو دەرۆزە و کاری بێیاسایی دیکە، گرنگترین رۆڵی ژینگەی خێزان لەسەر دایك وەستاوە لەبەر ئەوەی رەوشتی وەك ژن و وەك دایك لەماڵەوە پاشە رۆژی منداڵەکەی پێوە بەندە بێگومان رۆڵی خێزان لەم قۆناغە گرنگ ترە لە رۆڵی قوتابخانە لە پێگەیاندنی خوورەوشتی منداڵ، بۆ ئەوەی رۆڵی خێزان باش بێت لە پێگەیاندنی منالْ پێویستە رەچاوی ئەم لایەنانە بکرێت:

أ) لە ژن هێنان یاخود شووکردن پێویستە رەچاوی چەندان سیفەتی باش بکرێت لەلایەنی بەرامبەرەوە.

ب) پاش پێك هێنانی خێزان و منداڵ بوون پێویسته ئاگاداری پەروەردە کردنی ئەو منداڵە بن بە تایبەتی لە قۆناغی شیرپێدان وا باشترە کەوا دایکی شیری پێبداو لەباوەشی ئەودا گەورە ببێت، جان جاك ڕۆسۆ (١٧١٢_١٧٦٨) دەڵێ: ((پێویستە شیردەر تەندروستی باش بێت و هێمن و لەسەر خۆبێت لەبەر ئەوەی توندوتیژی و هەڵچوون و ڕووگرژی کار لەشیرەکەی دەکات)).

ج) قۆناغی بەخۆوەگرتن (حضانة) کەلەسێ ساڵیەوە دەست پێدەکات ئەم قۆناغەی تەمەنی منداڵ گرنگترین قۆناغەکانی ژیانی منداڵە لەبەر ئەوەی زۆر لایەنی کەسایەتی تیادا بنیاد دەنرێت، زانایانیدەروون ناسی مکوڕن لەسەر ئەوەی (٥) ساڵی بەرایی تەمەن بنچینەی کەسایەتی مرۆڤە لەم قۆناغەدا منداڵ هەوڵی لاسایی کردنەوە دەدات بە تایبەتی لاسایی کردنی باوکی لە خووڕەوشتیدا لەبەر ئەم هۆیانە پێویستە دایك و باوك لەم قۆناغەدا بە هێمنیو دروست ڕەفتار لەگەڵ منداڵەکانیاندا بکەن، تێبینی دەکرێ کەوا ژینگەی خێزان لەسەرتاسەری ژیانی مرۆڤ کاریگەرە و شوێنی دەمێنێت.

## ٢_ ژینگەی قوتابخانە

ئەگەر هاتو ژینگەی خێزان بەرپرس بێ لـە پێگـەیاندنی منالْ ئەوا ژینگەی قوتابخانە بەرپرسە لەپەرەپێدانی هۆش و فـێرکردن و پـەروەردەی دروسـت و ئاشـنا بـوون بـە خوورەوشتی باش وکاری ڕاست، قوتابخانە یەکەم کۆمەڵگەیە کە منالْ لەدەرەوەی خێزان ڕووبەڕووی دەبێتـەوە سیستـەمی قوتابخانـە یەکـەم سیستـەمی کۆمەڵگـەیـە کـە پێویست دەکـات مل کەچیبێو گوێ بۆ ڕێنماییەکانی ڕاگرێت لەبەر ئەم هۆیانە ژینگـەی قوتابخانـە بنچینـەی پـەرەپێدانی هـۆش و فێربوونـە، منـالْ فـێری چۆنیـەتی گونجـان لەگـەڵ کۆمەڵگـە دەکـات ڕۆشنبیریو بـەها مەزنـەکانی کۆمەڵگـە فێری قوتـابی دەکـات، بـەڵام کاریگـەری قوتابخانـە پێچەوانـە دەبێـت ئەگـەر هـاتوو گرنگی خۆی فەرامۆش بکات لـەم ڕوانگـەوە لەبـەر چاوگرتنی سیستەمە نوییەکان لە چۆنیەتی مامەڵە کردن لەگەڵ قوتابی و شێوازی فێرکردن و دەستـەبەر کردنـی پێویستیەکان بۆ ئـەم مەبەستە خاڵی سـەرەکی سـەرکەوتنی قوتابخانەیـە لـە پەیامـە پیرۆزەکەیدا.

# ٣_ ژینگەی کار

ئامانجی کارکردن پەیداکردنی بژێوە (خۆراك و پۆشاك و خانوو .... هتد) لە ئامارێکی گشتیدا دەرکەوتووە کە ١١٪ی تاوانباران بەساڵاچوانن کەواتە رێژەی هەرە زۆری تاوانباران لە خوار بەساڵاچوانن، لە یاسای چاودێری نەوجەوانان ژمارە ٧٦ی ساڵی ١٩٨٢ هاتووە (مێرد منالآن توێژێکن توانای کارکردنیان نییە) لەماددەی (٢٤) برگە (٢) هاتووە ((ئەو بچووکەی هەر پیشەیەك یان کارێك ئەنجام بدا کە لەگەڵ کەس و کاریدا (ذویە) نەبێت بەدەربەدەر دەژمێردرێت)).

لە ماددەی (٣) برگە (٢) هاتووە (( بچووك ئەو منالەیە کە (٩)ساڵی تەواو نەکردبێت)). ئەو منالأنەی لەو تەمەنەدا دەکەونە بەرکارکردن بەویستی خۆیان یا بەفەرمانی مالەوەیان ڕووبەڕووی چەندین شتی خراپ دەبنەوە وەکو جوندان و کارورەفتاری دیکە، بۆ زاڵ بوون بەسەر ئەم گیروگرفتەدا پێویستە بایەخ بدرێت بە فێرگە پیشەییەکان بۆ ئەوەی بەرێبازێکی دروست شارەزای ئەو پیشانە بن، و هەروەها هەوڵ بدرێت بە هەموو جۆرێك دایك و باوکان رێگا بە منالەکانیان نەدەن کەوا کاربکەن دوور لە خۆیان یان کارکردنیان بە شێوەیەك بێت کار لە خوێندن و خوێندنەوەیان بکات.

لە هەمان کاتدا بێکاری ڕۆڵێکی نالەبار دەبینێت لەلادانی بێکاران بەرەو کاری نایاسایی و بەرەو تاوان چوون، بۆ ئەو مەبەستە پێویستە هەوڵ بدرێت بەلای کەم کار بۆ ژمارەیەکی هەرە زۆری بێکاران دابین بکرێت تاوەکو ڕێ لەم هۆکارە نالەبارە بگیرێت بۆ ئەم مەبەستەش دەتوانرێت ژمارەیەکی زۆری یەکەکانی کۆمەڵگا لە بێکاری ڕزگاربکرێت بە کردنەوەی پرۆژەی جۆراوجۆری پێویست لەناو کۆمەڵگاکەمان لە ڕێگای دانانی بەرنامەیەکی تۆکمەی دروست.

## ٤_ بارودۆخی ئابووری

هۆکارێکە زاناو بیرمەندانی کۆن و نوێ دووپاتی دەکەنەوە وەك هۆکارێك لە هۆکارەکانی رەفتاری تاوانکاری هەربۆیەش پسپۆڕان جەخت لەسەر هۆکاری ئابووری دەکەن کە ڕۆڵێکی بەرچاوی هەیە لەسەر هەڵدانی دیاردەی تاوان، بەستنەوەی هەژاری بە تاوان مەسەلەیێکە هەر لەکۆنەوە باسی لێ‌کراوە، ئەرستۆ (٣٨٤_٣٢١ پ.ن)و ئەفلاتون (٤٢٧_ ٣٤٧ پ.ن) باسیان لێوەکردووە.

قەشە تۆماس ئەکوینی (١٢٢٥ _١٢٧٤)و تۆماس مۆر (١٤٧٨ _١٥٣٥) بۆ ئەوە چوو بوون کەوا هەژاری هۆکارێکی بنچینەییە لە رەفتاری تاوانکاری و زۆر لە تاوانەکان بە تایبەتی تاوانی دزی هۆیەکەی دەگەڕێتەوە بۆ نەبوونی، لەبەر فراوانترین ئەو لێکۆڵینەوانەی کە لەسەدەی (١٩) لەبارەی پەیوەندیی نێوان هەژاری و تاوان کراوە ئەو لێکۆڵییەوەیە بوو کە زانای ئیتاڵی (فورناری دی فیرس)ئەنجامی‌دا لە ناوچەکانی باکووری ئیتاڵیاو ئیرلەنداو خوارووی ویلزی نوێ‌و ئوستراليا لەو تاوانانەی کۆڵیەوە (دزی، ناپاکی، سوتان، ڕێگری، زینا، منداڵ کوژی، کوشتن، لێدان، دەست

درێژی کردنەسەر کارمەندانی دەوڵەت) گەیشتە ئەم ئاکامە کەوا بڵێ (هەژاری ئەو ژینگەیەیە کە تیایدا هەموو دەرفەتێك ئامادەیە بۆ ئەنجام دانی تاوان).

هەمدیس شێوە هەردوو زانای بەناوبانگ (ئەلبرت رایس) و (ئەلبرت لویس رودس) پاش دراسەیێکی زۆر گەیشتنە ئەو ئەنجامەی کەوا ئەو مێرد مندالأنەی لاساری (انحراف)دەکەن لە چینێکی هەژاری کۆمەڵن و لەگەڕەکە هەژارەکانی کۆمەڵن، لە تۆژینەوەیێکدا د. نزار محمدامین مامۆستا لە کۆلێژی پزیشکی لە زانکۆی سەلاحەددین لە بارەی ئەونەوجەوانانەی تۆمەتبارن بە دزی و ئەوانەی بۆ دادگا رەوانەکراون لەشاری هەولێر لە ماوەی (٦٢) مانگدا لە ١٩٨٥ _ ١٩٩٠ دراسە لەسەر (٢٤١) باردا کراوە لەلایەن نووسینگەی دراسەی کەسایەتی لە ڕووی دابەشبوونی نەوجەوانە لاسارەکان دەرکەوتووە زۆربەی ئەم لاسارانە لە گەرەکە میللیەکانن.

دابەشکردنی جوگرافی ناوشاری هەولێر

| | |
|---|---|
| تەیراوە | ٪٩,٧ |
| باداوە | ٪٦,٧ |
| سێتاقان | ٪٦,٢ |
| کوران | ٪٤,٤ |
| کوردستان | ٪٣,٨ |

| | |
|---|---|
| عداله | ٪٣,٨ |
| ئيسكان | ٪٣,٥ |
| عەنكاوە | ٪٣,٥ |
| قەلاّ | ٪٣,٥ |
| برايەتى | ٪٢,٦ |
| سەيداوە | ٪٢,٦ |
| تەعجيل | ٪٢,٦ |
| مەنتكاوە | ٪٢,٦ |
| شۆڕش | ٪٢,٣ |
| ئازادى | ٪٢ |
| كورانى عەنكاوە | ٪١,٧ |
| بەستە پيازە | ٪١,٧ |
| ڕۆناكى | ٪١,٢ |
| گەڕەكى ٩٢ | ٪١,٢ |
| نەورۆز | ٪١,٢ |
| لەتيفاوە | ٪٠,٩ |
| بلاشاوە | ٪٠,٩ |
| گەڕەكى ئەفسەران (حى الظباط) | ٪٠,٩ |
| ڕزگارى | ٪٠,٩ |
| خانقاه | ٪٠,٩ |
| مەلايان | ٪٠,٩ |
| شەهيدانى كوران | ٪٠,٦ |
| دەواجن | ٪٠,٦ |
| دىٚى بيركۆت | ٪٠,٦ |

| | |
|---|---|
| گلکەند | ٠,٦٪ |
| ناوچەی پیشەسازی باکورر | ٠,٦٪ |
| راپەرین | ٠,٣٪ |
| گەرەکی پۆلیسان (حی الشرطة) | ٠,٣٪ |
| عەرەبی نویٚ | ٠,٣٪ |
| عەرەب | ٠,٣٪ |
| کارگەی جگەرە | ٠,٣٪ |

بەلاّم هەردوو زانای ئەمەریکی (ولیام هیٚلی)و (نوغستابرون) لە توێژینەوەیێکدا لەبارەی کاریگەری بارودۆخی ئابووری لەسەرهەلّدانی تاوان (٦٧٥) میٚرد منداڵی لاساریان بە نموونە وەرگرت بۆیان دەرکەوت (٥٠٪)یان لە هەژارییێکی زۆر سەختدا دەژین و (٢٢٪)یان لە هەژارییێکی ئاساییدا دەژین و (٣٥٪)یان باری ئابووریان مام ناوەندییە و (٣٤٪)یان لە خۆش گوزەرانیدان و (٤٪)یان دەوڵەمەندن، واتە تەنها (٢٧٪)یان لە هەژارەکانن.

کەواتە تەنها هەژاری هۆکاری تاوان نییە بەلّکو دەوڵەمەندیش هۆکاریٚکە بۆ جۆرەها تاوان، دەگەینە ئەو ئەنجامەی بلّیین خیٚزانی دەوڵەمەندو خیٚزانی هەژار پێویستی‌یان بە پەروەردەکردنی دروستی منداڵەکانیان هەیە.

## ٥_ ڕاگەیاندن

کارتێکردنی دەزگاکانی راگەیاندن (ڕۆژنامەو سینەماو تەلەفزیۆن و شانۆو ...) لەسەر مرۆڤدا زۆرە، بە تایبەتی لەسەر مێرد منالأن و هەرزەکاراندا، واتە ئەو ڕەوشتانەی کەوا لە ئامرازەکانی ڕاگەیاندن دەیبینێت بە تایبەتی توندوتیژی یاخود کوشتن وا دەکا ببێتە شتێکی ئاسایی لای و بە خراپ لە دەروونییان جیٚی خۆی دەکاتەوە، شتێکی ئاسایی‌یە کە تەمەن بچووکەکان زیاتر دەکەونە بەر کاریگەری ئامرازەکانی ڕاگەیاندن بە هۆی ئەوەی سیستەمێکی بەرگری‌یان نی‌یە بۆ هەڵسەنگاندنی ئەو ڕەوشت و هەڵوێستانەی دەیبینن، ئامرازەکانی ڕاگەیاندن کاریگەرییان تەنها بەسەر ئەو کەسانەوە دەبێت کە ئامادەییان هەیە بۆ وەرگرتنی ئەم جۆرە ڕەوشت و بیروبۆچوونانە کە لەڕێگای بیستن و خوێندنەوەو بینیندا پێیان دەگات.

کەواتە پێویستە لیژنەیێکی پسپۆڕ هەبێت بۆ سەرپەرشتی کردن و هەڵسەنگاندنی ئەو بابەتانەی لە تەلەفزێۆن و سینەما نیشان دەدرێت، بۆ ئەوەی لەلایەنی ناهەمواری ئەمانە بە تایبەتی و ئامرازەکانی دیکەی ڕاگەیاندن بەگشتی کاریگەری خراپیان لەسەر کۆمەڵگا نەبێت.

## ٦_ نەخوێندەواری

نـەخوێندەواری ڕێخۆشـکەرە بـۆ سـەرهەڵدانی چـەندین دیاردەی نامۆ لە هەمان کاتدا ئەگەر ئەو کەسە سادەو سووك باوەڕ بێت بـە ئاسـانی بـەرەو کـاری تـاوان و لادان لـە یاسـا دەبردرێـت کەواتـە نەهێشـتنی نـەخوێندەواری پێویسـتێکی بەردەوامە، بۆیە خوێندەواری شتێکی پیرۆزو پێویستە لەناو یەکـەکانی کۆمـەڵگا لـەپێناو پـەرەپێدانی و پێشـڤەچوونی خودی کۆمەڵگاکە بۆیە پێویستە بەردەوام جەخت لەسەر ئەوە بکرێت کە نەخوێندەواری لەناوماندا نەمێنێت.

لـە هـەمان نووسـینەکەی د. نـزار محمدامـین لـە ڕووی بارەکـانی دزی لەلایـەن نەوجـەوانان لـەدادگای نەوجـەوانانی هـەولێر کـە بـەزمانی ئینگلـیزی نووسـراوە لەهەمەلایـەنی هۆکارو پیشەو باری خێزانیـان و هـەموو لایەنـەکانی دیکـەی پەیوەست بەم لایەنە بەم شێوەی خوارەوە باسی هۆکارەکانی ئەنجام دانی ئەم تاوانە و پیشەی تۆمەتبارانی کردووە.

### هۆکارە پاڵنەرەکانی ئەنجام دانی تاوان

| | |
|---|---|
| نەزانراو | ٪٢٨,٤ |
| برادەری خراپ | ٪٢٦,٤ |
| خێزانی لێك ترازاو | ٪١٧,٩ |

| | |
|---|---|
| خۆهەڵقورتاندن و تاقی کردنەوە | ٪١٣,٣ |
| فریودان لەلایەن گەورەکان | ٪٢ |
| خێزانیکەم تەرخەم | ٪١٢,٣ |
| پێویستی دارایی | ٪٩,٤ |
| کارکردن لە تەمەنی بچووکیدا | ٪١,٢ |
| هانابردن لە پێناو پارمەتیدا | ٪١,٢ |
| سروشتی ئیش کردن | ٪٥,٩ |
| کارناکات، وازی لە قوتابخانە هێناوە | ٪٥,٣ |
| هەڵگرتنی چەك بە بچووکی | ٪٢,٩ |
| تۆڵەکردنەوە | ٪٢,٦ |
| حەزی دەرکەوتن و باڵا دەستی | ٪٢,٣ |

## پیشەی تۆمەتباران

| | |
|---|---|
| کرێکاری ناکارامە | ٪٣٨ |
| قوتابی | ٪٢٤ |
| چەکداری خۆفیداکار | ٪١٣,٨ |
| کرێکاری کارامە | ٪١٠ |
| بێکار | ٪٨,٥ |
| باخەوان | ٪٢,٤ |
| خاوەن دوکان | ٪١,٧ |
| ژنی ماڵ | ٪١,٦ |

# هۆکارە ناوەکیەکان

هەوڵدان بۆ نەهێشتنی ڕەفتاری تاوانکاری بابەتێکی تازەنییە بەڵکو هەر لە کۆنەوە کۆمەڵگاکان بەپێی توانای خۆی هەوڵی نەهێشتنی ئەمەیان داوە، بۆ ئەوەی بتوانرێت زۆر یاخود کەم ئەم ڕەوشتە دەوری بگیرێت و پاشان بن بڕ بکرێت، پێویست بەوە دەکات هۆکارەکانی بزانرێت بۆ ئەوەی دەستی بەسەردا بگیرێت و ڕێگای تەشەنە کردنی نەدرێت.

هۆکارە ناوەکیەکان بریتین لەو هۆکارانەی پەیوەستن بەخودی مرۆڤەکە، واتا دەوروبەر نابێتە هۆکارێکی سەرەکی،

- ئەم هۆکارانە لەناوەوەی تاوانکار هەڵدەقوڵێن ودەبنە هۆی ئەوەی تاوان ئەنجام بدات یاخود بەرەو ئەنجامدانی تاوانی ببات.

زانایان لەم بوارەدا هەریەکەو بەپێی ئەو ئامار (احصاء)و لێکۆڵینەوانەی کردوویانن، هۆکاری ڕەفتاری تاوانکاری بۆ لایەنێکی ناوەکی تاوانکار دەگەڕێننەوە،ئەوەتا سیزار لومبروزو lombroso cesare ١٨٣٥_ ١٩٠ڕەفتاری تاوانکاری بۆ لایەنی نەخۆشی (باسۆلۆجی) گەڕاندەوە و چەندین تایبەتمەندین (خصائص)ی بۆ تاوانکارەکان دانا،

مامۆستا ادر (Ecder) و هەردوو زانایان ریکمان (Reikman) و ریك (Reick) و چەندان زانای تر لەم بوارەدا هۆکاری رەفتاری تاوانکاری دەگەڕێننەوە بۆ لایەنی دەروونی (نفسي)، دکتۆر هنری گودارد (H.godard) لەسەرەتای ئەم سەدەیەدا پاش چەندین لێکۆڵینەوەو تاقیکردنەوە گەیشتە ئەو رایەی کەوا هۆکاری رەفتاری تاوانکاری دەگەڕێتەوە بۆ لایەنی ژیری (عقلي) بەهەردوو رادەیەوە (واتا زۆر ژیری یاخود کەم ژیری) و لە لێکۆڵینەوەکانیدا گەیشتە ئەو ئەنجامەی کەوا ٥٠٪ی تاوانکاران (المجرمون) کەم عقل (Mentally Defective) بوون.

ئێمەش لێرەدا هەوڵ دەدەین هەندێك لەو هۆکارە ناوەکیانە بخەینە روو و تاوتوێی بکەین و رای زانایانی ئەم بوارە لەسەر هۆکارەکان بخەینە ڕوو، دوا بەدوای ئەمەش رایە پێچەوانەکانیش دەخەینە روو لەبەر ئەوەی زانایان کە بۆ هۆکارێك دەچن مەرج نییە تاکە هۆکار بێت یاخود بەڵگەی بنبڕیان هەبێت بەڵکو هەندێکیان تاکو ئێستا هەر لەبواری لێکۆڵینەوەدا ماونەتەوە.

## ١_ زگماكی (وراثة)

زگماكی بریتی‌یه له گواستنه‌وه‌ی تایبه‌تمه‌ندی (صفات) له بنجـــه‌وه (دایــك و بــاوك) بــۆ لقــه‌كان (منـــاڵ) بـــه‌هۆی كرۆمۆسۆماته‌وه (Chromosomes) له‌شی مرۆڤ پێك دێت له ملیۆنه‌ها شانه، و هه‌ر یه‌ك له‌م شانانه له (٤٦) كرۆمۆسۆم پێك دێـت كۆرپۆلـه (جنین) لـه (٢٣) كرۆمۆسـۆمی دایــك و (٢٣)ی باوكی پێك دێت واته ئه‌و شانه نوێیه نیوه‌ی له باوك وه‌رده‌گرێــت و نیــوه‌ی لـــه دایــك وه‌رده‌گــرێ، دۆزینـــه‌وه‌ی یاساكانی زگماكی (وراثة) ده‌گه‌ڕێته‌وه بۆ زانـای نه‌مساوی جوهان گریگور مندل (Joha Gregor Mendel) زانایـان دووره په‌رێز له دۆزه‌كانی زگماك نه‌وه‌ستاون به‌ڵكو گریمانی (پێكهاتـــه‌ی تاوانكـــاری زگمـــاك) (التكویـــن الاجرامـــي الموروث)یان خسته روو هـه‌وڵیاندا ئـه‌م گریمانه‌یه به‌چه‌ند رێگایه‌ك بسه‌لمێنن له‌م رێگایانه:

یه‌كه‌م/ به‌راورد كردنی تاوانكارو مرۆڤی به‌رایی: لومبرورو یه‌كێك بوو له‌یه‌كه‌می ئه‌وانه‌ی گرنگی‌ی زگماكیان خسته روو دروسـت بـوون (التكویـن)ی ره‌فتـاری تاوانكـاری نموونـه‌یی (الجـرم النموذجـي)، لـه‌بۆچوونی لومـبرۆزو، تاوانكـار لـه‌باو

باپیره سەرەتاکانەوە، تایبەتمەندییە ناژەڵییە دڕندانەکانی، وەرگرتووە، بۆیە ئەم تاوانکارە وەکو پێشووەکان دڵ ڕەقەو هەستی نییەو خۆپەرستەو ژیانێکی ئاژەڵی دەباتە سەر، لەگەڵ ئەوەی لۆمبرۆزۆ، ئەم بۆچوونەی خستە ڕوو بەڵام ژمارەیەکی کەمی زانایان بەراستیان زانی، ئەمەش دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی لۆمبرۆزۆ نەیتوانی بە بەڵگەی زانستیانە بیانسەلمێنێ بەڵکو لەراستیی دووربوون.

دووەم/ لێکۆڵینەوە لە خێزانە تاوانکارەکان: هەردوو زانایانی ئەمەریکی ریتشارد دگدیل (R.L.Dugdale)و ئادتور ئستابروک(A.H.Estabrook) بوونی شەش بەندکراو لەیەك خێزان لە یەکێك لە بەندیخانەکانی ولایەتی نیویورك ساڵی ١٨٧٤ سەرنجیانیان راکێشاو دەستیان کرد بەلێکۆڵینەوە لەسەر ئەمە. لەکۆتاییدا بۆیان دەرکەوت باوکی گەورەیان ناوی ماکس جوکس Max Jukes بوو لە ساڵی ١٧٢٠ لەدایك بووەو باوکی ئەڵمانیبووە، پاشان چۆتە ئەمەریکاو لە نیۆیۆرك دانیشتووە بەکاری راوکەری (صید) خەریك بووەو لەناو خەڵك ناسراو بووە کەوا زۆر مەی دەخواردەوەو زۆر حەزی لە ئافرەت بووە، پاشان ژنێکی هێناوە (ئادا یالکس Ada Yalkes)، لە دزیدا دەستێکی

بالأى هەبووە، ئەم دووە واتا (ماكس _ يالكس) زۆر منالْ و نەوەيان پەيدا كردووە، هەر دوو زانايان كە دراسەتى نەوەكانيان كردووە بۆيان دەركەوتووە لەپاش ئەوەى (گديل) لە ٧٠٩ كەسى ئەم خێزانەى كۆلێتەوەو زانا (ستابرول)تا سالْى ١٩١٥ توانى ٢٠٩٤ كەس لەم خێزانە دراسەت بكات، دەركەوت كەوا ژمارەيەكى زۆر لەم خێزانە منالْى بيژێن و دزو پياو كوژو بێشوێن و مەى خۆرو لەش فرۆش (بغايا)و كەم عەقل و ... لێيان دەرچووە و ماكس و نەوەكەى زيانێكى زۆريان هەبووە بۆ ئەمەريكا لە رووى سەرف كردنى دراو بۆ گرتن و بەند كردن، هەروا زەرەرێكى زۆريان لە خەلْك داوە.

چەندين لێكۆلْينەوەى دى لەسەر ئەم خێزانە، دەريانخست كە زۆربەى منالْ و نەوەيان خراپ بورن، بەلاْم ئەوەى راستى بێت زانايان لەم لێكۆلْينەوانەدا تەنها چەند خێزانێكيان وەرگرتبوو ئەمەش نابێتە رێسا (قاعدة) بۆ هەمو خێزانەكانى ديكە، هەرودها لە لێكۆلْينەوەكان زۆر وورد نەبوونە، ئەوەتا لە لێكۆلْينەوەيان بۆ سەلماندنى گريمانەكەيان بۆ ئەوە چووبوون كەوا خێزانى قەشە (جوناثان ادوارد J.E.Edward) تاوانكارو خراپيان نەبووە وەكو نموونەى خێزانى باش لە رابووردوويان كۆلْيبۆوە، بەلاْم پاشان لە لێكۆلْينەوەيەكى ديكە دەركەوت كە

داپیری دایکی، بەتاوانی زینا گیراوەو پلکی باوکی کوڕی خۆی کوشتووەو مامی باوکی برای خۆی کوشتووە،

لەلایەکی ترەوە ئەم زانایانە ئەوەیان بۆ ئێمە روون کردۆتەوە، کاتێك ئەم سیفەتانە لەباوکە گەورەوە دێت بۆ نەوەکانی چۆن دابەش دەکرێت و ئەوەیان لەیاد کردووە کەوا دەورو بەر کاریگەرێکی زۆری هەیە، ئەوەتا زانا (دالستروم Dahlstrom) لە یەکێك لە لێکۆڵینەوەکانیدا سەلماندی کەوا ژینگە زۆر کاریگەرە بەوەی کە شەش منالی لە خوار (٧)سالی کە لە خێزانێکی ناسراوبوون بە تاوانکاری، لەم خێزانەی دوور خستنەوەو ژیانێکی باشیان بۆ تەرخان کردن لە کۆتاییدا توانرا بەبێ تاوانیی، ژیان ببنە سەر.

رێگاکانی تر بۆ سەلماندنی دەوری زگماکی لە رەفتاری تاوانکاری وەکو ئاماری بەراوردکاری نێوان باوك و منالەکانیان یاخود لێکۆڵینەوە (دراسة) کردنی جمك (توام)و ئەوانی دیکە کاریگەری هەیە لە رەفتاری تاوانکاری لەبەر ئەوەی زانایان لە لێکۆڵینەوەکانیان دا لایەنی ژینگەیان فەرامۆش دەکردو لە لێکۆڵینەوەکانیان تەنها کوڕیان وەردەگرت یاخود لە دراسەکردنی خێزان دا تەنها چەند خێزانێکیان وەردەگرت.

بۆیە لێرەدا بە پێویستی دەزانم کەرای چەند نووسەرێك و زانایێك لە بارەی دەووری زگماکی لە رەفتاری تاوانکاریدا بێنمەوە.

د. عبود سراج لە کتێبی (علم الاجرام وعلم العقاب) نووسیویەتی (تاکو ئیمرۆ بەبەڵگە ئەوە یەکلانەبۆتەوە کە پەیوەندی لە نێوان زگماکی و رەفتاری تاوانکاری هەبێت، زانا (ولیام هیلی_ William Healy) زانیاری لەسەر (١٠٠٠) بار کۆکردەوەو رایگەیاند، کە لەیەکێك لەم حاڵەتانە وەکو بەڵگە دەرنەکەوتووە سیفەتی مەیلی تاوانکاری (میل نحو الجریمة) لە زگماکیەوە ببێت.

د. محمد شلال حبیب مامۆستای یاسای تاوانکاری لە کتابی (اصول علم الاجرام) بەو واتایەی نووسیوە: (ئەگەر تایبەتمەندی بە زگماکی بگوێزراباوە خوای گەورە پێغەمبەری نەدەنارد بۆ چاك کردنی مرۆڤ، لەبەر ئەوەی شتێك زگماك بێت ناگۆڕێ تەنها بەزگماك نەبێت ئەوەش شتێکی مەحاڵە، راستیەکەی ئەوەیە کە رەوشتی مرۆڤ بە زگماکی نییە، لەبەر ئەوەی لەنێوان باش و خراپ دایە ئەمەش شتێکی روحانیە هیچ پەیوەندیی بە زگماکییەوە نییە، بەڵگەی پێشینانمان زۆرە لەم بارەیەوە کاتێك کەسێتی ئەوانەی لە کاتی نەزانی (جاهلی) چۆن بوون پاشان لەناو ئیسلامدا چیان لێهات، ئەگەر تاوان

پەیوەست بایە بە یاسای زگماکی، ئەوا رەوشتی ئەمانە نەدەگۆڕا بۆ باشتر و هەوڵەکانی باش کردنەوەی مرۆڤی خراپ سەری نەدەگرت و مەحاڵ دەبوو، بۆیە ئێمە زگماکی بە هۆکارێك نازانین لە رەوشتی تاوانکاریدا....)

د. مصطفی ابراهیم الزلمی لە کتابی (منهاج الاسلام لمکافحة الاجرام) لەلاپەرە( ١٨)دا نووسیویەتی (ئەوەی زگماکی دەگوێزرێتەوە ئەو تایبەتمەندیانە نین کە بۆ خەڵك دیارن بەڵکو ئەو توانایە دەگوێزرێتەوە بۆ لە خۆگرتنی ئەو تایبەتمەندیانە).

لێرەوە بە پێویستی دەزانم کەوا هەر دوو فەرموودەی پێغەمبەری مەزن (د.خ) بهێنمەوە کە دەفەرموێت (تخیروا لنطفکم فان العرق نزاع)و هەروەها دەفەرموێت (تزوجوا في الحجر الصالح فأن العرق دساس)، بۆیە بەڕای من ئەوەی مامۆستای بەڕێز دکتۆر مصطفی الزلمی بۆی چووە زۆر راستە، کەواتە دەبێ لە کاتی پێك هێنانی خێزان، هەردوو لایەنی باشی‌و خراپی کوڕو کچ ڕەچاو بکرێت بۆ ئەوەی خێزانێکی باش پێك بهێنن.

## ٣_ تەمەن:

تەمەن کاریگەریێکی زۆری هەیە لەسەر رەفتاری تاوانکاری واتە مرۆڤ لە ئەنجام دانی جۆری تاوان و شێوازەکەی، لە تەمەنێکەوە بۆ تەمەنێکی دیکە جیاوازیەکی زۆری هەیە، یاخود هەندێك تاوان مرۆڤ لە تەمەنێك ئەنجامی دەدات بەلاّم لە تەمەنێکی دیکە لەبەر زۆر هۆکار ئەنجامی نادات بۆیە بایەخ دان بە تەمەن بۆ نەهێشتنی تاوان کارێکی زۆر گرنگە بە تایبەتی کاتێك هەولْ دەدرێت رێگا لەبەرەو ئەنجام دانی تاوان بگرێت، بۆیە بە پێویستی دەزانین باسی تەمەن بکەین وەکو هۆکارێکی ناوەکی رەفتاری تاوانکاری، مرۆڤ لەو کاتەی دێتە دنیاوە لە هەر قۆناغێکی تەمەنیدابێ چەند تایبەتمەندییێکی لەلاوە گەلاّلە دەبێت، مرۆڤ لە قۆناغی هەرزەکاریدا زوو تورە دەبێت و دەم دەمیەو حەز لەبەشەکەی تری دەکات و زۆر بیْهێزە لە دان بەخۆداگرتندا، بەلاّم مرۆڤ لە پیریدا گران و لەسەر خۆیە و زۆر مەیلی خۆ وویستی دەکات و گویْ لەقسەی کەسانی تر ناگرێت، بیْگومان دیاری کردنی ئەو تاوانانەی کەوا ئەنجام دەدرێن بە زۆری لەهەر قۆناغێکی تەمەندا سوودی زۆرە بۆ نەهێشتنی تاوان و دۆزینەوەی ئەو کەسانەی گومانی ئەنجام دانیان لیْدەکرێت

لەلایەك و چۆنیەتی نەهێشتنی هۆكارەكان لەلایەكی دیكەوە بۆ ئەوەی بتوانرێت ئەنجام دانی تاوان بەپیٚی توانا بنبر بكرێت، ژیانی مرۆڤ بە چەند قۆناغێك دابەش دەكرێت:

١_ قۆناغی منالّی.

٢_ قۆناغی مێرد منالّی و گەنجێتی و لاویی.

٣_ قۆناغی بەساڵاچوویی (كهولة).

٤_ قۆناغی پیری (شیخوخة).

لەهەر قۆناغێك لەم قۆناغانەدا جۆرە تاوانێك ئەنجام دەدرێت، لە قۆناغی میرد منالّی لە تەمەنی (٩) سالّیدا بەپیٚی ماددەی (٣)ی برگەی یاسای ژمارە (٧٦)ی سالّی ١٩٨٣، لێپرسراویەتی جەزائی چاودێری نەجەوانانی لەسەرە، هۆی زیاتر بوونی تاوانێك لە قۆناغێكی دیاری كراو دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی كەوا لەهەر قۆناغێك هەندێك تایبەتمەندی هەیە وای لێدەكات ئامادەیی ئەوەی هەبێت ئەم تاوانە ئەنجام بدات لە كاتی بوونی بە تاوانكار. هەروەكو چۆن زانایانی ئەم بوارە روونیان كردۆتەوە (رەمسیس بەهنام) لە كتابەكەی (المجرم تكويناً وتقويماً) لەبابەتی تاوان و تەمەندا نووسیویەتی (ئامارەكان سەلماندوویانە كەوا زۆربەی تاوانەكان لەلایەن ئەو تاوانكارانە ئەنجام دەدرێت كە تەمەنیان لە نێوان

(١٨_٢٠)ساڵدان و زۆربەی تاوانەکانی ئەم قۆناغە تاوانی لێدان و بەگژیەکدا چوون و تاوانی سۆزیو شێتانەن) هەروەها نووسیویەتی (تاوانی دزی لە نێوان (١٦←) ساڵیدا لەو پەڕی بەرزیدایە، پاشان تاوانی دزی لە تەمەنی (٣٠) ساڵیدا بەرەو نزمی دێت، لەتەمەنی رسکاو (نضج) زیاتر تاوانی کوشتن و دزی گەورە ئەنجام دەدرێت، تاوانی سۆزی لە تەمەنی (٢٠_٤٠) ساڵیدا زۆر زیاد دەکات، لە تەمەنی بەساڵاچووندا تاوانی لادان لە رەوشتی راست و بوختان و جنێودان و شاردنەوەی شتومەکی دەستکەوتوو، زیاتر ئەنجام دەدرێت، لێرەوە بۆمان دەردەکەوێت کەوا لەناو کۆمەڵگەدا پێویستە لەهەر قۆناغێکدا رەفتار لەگەڵ کردنی جیاواز هەبێت لەگەڵ قۆناغێکی تردا و ئەمەش ئەهێشتنی تاوان کەمتر دەکات.

د. عبود السراج لە کتابی (علم الاجرام وعلم العقاب) لە بابەتی تاوان و تەمەن لەلاپەرە (٢٢٣)دا یەکێك لەو دابەش کردنانەی قۆناغەکانی مرۆڤی هێناوەتەوە کە ئەمەی خوارەوەیە: ١_ قۆناغی منالی (طفولة) لە (٦_١٢) ساڵ.

٢_ قۆناغی هەرزەکار (مراهق)لە (١٢_١٨) ساڵ.

٣_ قۆناغی گەنجی گەورە لە (١٨_٢٥) ساڵ.

٤_ قۆناغی گەورە گەنج لە (٢٥_٣٥) ساڵ.

٥_ قۆناغی گەورەی تەواو لە (٣٥_٥٠) ساڵ.

٦_ قۆناغی بەرەو خوار لە پاش (٥٠) ساڵی دەست پێدەکات، قۆناغی پیری لە پاش (٦٠) ساڵی دەست پێدەکات.

هەروەها د. عبود سراج نوروسیویەتی (تاوانی دزینی ئۆتۆمبیل و دزینی ماڵان لەلایەن هەرزەکاران (مراهقین) زیاتر ئەنجام دەدرێت.... لە تەمەنی ١٨ _ ٣٠ ساڵیدا تاوانی توندوتیژی (جرائم العنف) زیاتر ئەنجام دەدرێت و تاوانی کوشتنی گەورە زیاتر لە تەمەنی رسکاودا دەبێت. گومانی لەوەدانییە کەوا بایەخ دان بەقۆناغەکانی تەمەن لەناو کۆمەڵگە، زۆر گرنگە بۆ نەهێشتنی تاوان، لەهەر تەمەنێك مرۆڤ پێویستی بە جۆرە پەروەردەیەك دەبێت و جۆرە ئاگا لێبوونێکی دەوێت بۆ ئەوەی لە تاوان دووربێت ئەمەش وامان لێدەکات بزانین کەوا چۆن منال لە تاوان بەدوور دەگرین، کاتێك زانیمان کام تاوان زیاتر ئەنجام دەدرێ‌و ئەوکات دەتوانین وا لەمناڵەکە بکەین بە شتێکی دیکەوە خەریك بێت، هەروەها کاتێك زانیمان لەپیریدا کام تاوان زیاتر ئەنجام دەدرێ لەو کاتەدا دەتوانین رێگای باش بۆ چارەسەر کردنی تاوانەکان بدۆزینەوە.

## ٣_ بەکارهێنانی مەیو تریاك:

کاتێك مرۆڤ مەی یاخود تریاك بەکاردەهێنێت، بێ ئاگا دەبێت و چەندەها تایبەتمەندی لێبەدی دەکرێت، تایبوت (Tiebout) لەماوەی لێکۆڵینەوەی (٩)ساڵیدا کە (٢٠٠) حاڵەتی خوو بەمەی گرتووی ئەنجام دابوو، بۆی دەرکەوت کە ئەم تایبەتمەندیانە لەم کەسانە بەدی دەکرێت:

ا_ پێویستییەکی نەستکارانە بۆ بەسەرداگرتن.

ب_ بەسەردا زاڵ بوونی هەستێکی دوژمنکاری.

ج_ پەیدابوونی توانای پلەی بەرزبوونەوەی هەڵچوون.

د_ هەست کردن بە تەنیایی و گۆشەگیری.

هـ_ خوازیاری پێگەیشتن.

ئەو کەسانەی کەوا خوویان بەمەی خواردنەوە یاخود تریاك بەکارهێنانەوە گرتووە، سانسۆری رەوشتیی لایان نامێنێت و دوژمنکاریانە رەفتار دەکەن و ئارەزووی ئەنجام دانی تاوانی کوشتنیان لازۆر دەبێ زۆر تاوانیش ئەنجام دەدەن، وەکو فڕاندنی منداڵ و ئابڕوبردنی و دزی و بردنی ماڵی دەوڵەت، ئەو لێکۆڵینەوانەی کەوا ئەنجام دراون ئەوەیان دەرخستووە کەوا مەی خواردنەوەو بەکارهێنانی

تریاك هۆكارێكی رەوشتی تاوانكاریە، ئەوەتا لە فەرەنسا زانای ئەم بوارە (روگ دو فورساك Rogues De Fursac) پاش لێكۆڵینەوەیێكی زۆر، بۆی دەركەوت كەوا ٦٦٪ تاوانە كەسێتیەكان و ٥٦٪ رەوشتی‌یەكان، لەلایەن مەیخۆرەكان ئەنجامدراون و لەلاپەرە (٢٥)ی كتابی (سیكولوجیە المجرم)ی د. عبدالرحمن العیسوی هاتووە (نەك تەنها زۆر خواردنەوەی مەی بگرە كەم خواردنەوەش بەرەو ئەنجام دانی تاوانی كوشتن و توندوتیژی دەبات ، دەركەوتووە ١٦ لە ١٧٤ باری ئەوانەی نەخۆشی صەرع وناتەواوی گەشەی لەش و ئامرازەكانی نائاسیین، بەلاّم ماندوون لەژیان یا لە ژێر گوشارێكی دیكەن یا هەر نەخۆشێكی لەم بابەتە تاوانبار كراون بە تاوانی گەورە و هەوڵدان بۆ كوشتن و دزی و دەست درێژی سیكسی و سوتاندنی بەئەنفەست لەگەڵ ئەوەش زانایان بە بنبڕی نەیان سەلماندووە كەوا پەیوەندی تەواو لە نێوان تاوان و بەكارهێنانی مەی یاخود تریاك هەیە.

## ٤_هۆكاری دەروونی:

زۆر لـە زانايـان بـۆ ئـەوە دەچـن كـەوا هۆكـاری دەروونـی كاریگەریێكی زۆری هەیە لە رەوشتی تاوانكاری و مرۆڤ روەو ئەنجام دانـی تـاوان دەبات، زانا ئادلر (adler) بۆ ئـەوە چـووە پـاش ئـەوەی چـەندین لێكۆڵینـەوەی لەسـەر كەسـانی لەیاسـا دەرچـوو كـرد، كـە لـە بنجـدا بـۆ هەسـت بەكـەم و كـوڕی كـردن (Inferiority) یاخود بۆ هۆی هەست كردن بەنەبوونی دڵنیایی (Fee ling of insecurixy) لەلایەن ئەو كەسانەوە، دەگێڕێتەوە. ئـەم هەسـت كردنانـەش راسـت بـن یـاخود تـەنیا خـەیاڵ بـن لەراستیدا حەز كردنی ئەو كەسانەیە لە (دەسـەڵاتداریتی) لەبەر ئـەوەی مـرۆڤ لەسـەرەتایی ژیانیـەوە حـەز لـە خۆدەرخسـتن و دیاربوون و بردنەوە دەكات ئـەو حـەزو ویستەی لەبەر چـەندەها هۆ نایێتە دی، بۆیە وای لێدێت هەست بە ژێركەوتوویی و هەست بە كەم و كوڕی دەكات.

ئـەو هۆكارانـەی یارمـەتی دروست بوونـی ئـەم هەسـتە دەدەن (بوونی كەم و كوڕی لە لەش یاخود كـەم عـەقڵی یـاخود ژینگـەی خراپ) ئەم هەست كردنـەش زۆر جار مرۆڤ بـەرەو ئـەنجامدانی تاوان دەبات یاخود وای لێدێ هەڵس وكەوتی تاوانكاری ئـەنجام بدات بۆ پڕكردنـەوەی ئـەو كـەم و كوڕیـەی هەسـتی پێدەكـات،

دەبێت ئەوەش بزانین کەوا تەنها هەست کردن بە کەم و کوڕی مرۆڤ بەرەو تاوان نابات بەڵکو زۆر جار مرۆڤی زۆر زیرەك بەرەو تاوان دەڕوات ئەویش لەبەر ئەوەی ئەو مرۆڤە وادەزانێت کەس وەکو ئەو زیرەك نییە و هەرچی بیەوێت بەسەرکەوتوویی دەیکات و ئەنجامی دەدات، بۆیە پێویستە مرۆڤ هەر لە منالّیەوە وا پەروەردە بکرێت کەوا لەهەر دوو لادا بەرەو هەڵس وکەوتی تاوانکاری نەڕوات، بەڵکە لە کاتی کەم و کوڕی دەتوانێت بەلایەنی باشە پڕی بکاتەوە و کاتی زۆر زیرەکیش بۆ شتی باشە.

پوختەی بۆچوونی (ئادلر) هۆکاری دەروونی بۆ راڤەکردنی رەفتاری تاوانکاری، بریتی‌یە لەتیوری چەپاندن (کبت)ی حەزو ویستراوەکان، کە دەبێتە هۆی دورست بوونی گرێ کوێرەیەك لە دەروونی و خۆی لە هەست کردن بەکەم و کوڕی دەنوێنێت ئەم کەم و کوڕیەش کاردەکاتە سەر رەوشت و سەلامەتی ژیریی، ئەمەش زۆر جار بەهۆی رەفتاری تاوانکاری دەیەوێت پڕی بکاتەوە، چارەسەرکردنی ئەم جۆرە مرۆڤانەش بەهۆی شیکردنەوەی دەروونی (التحلیل النفسی) دەبێت و هەر لەم بارەوە چەندین زانای دیکە بیرو بۆچوون و بیرۆکەی تریان داناوەو چەندین لایەتی تریان گرتووە، بەلام ئێمە بیرۆکەی (ئادلر)مان تەنها وەکو یەکێك لە دراسەکانی لەبارەی هۆکارە

دەروونیەکان هێناوە، دەبێت ئەوەش بزانین کەوا هۆکاری دەروونی و کاریگەریی لەسەر رەفتاری تاوانکاری، بێ کەم و کوڕی نیە ئەوەتا د. عبود السراج لە کتابی (علم الاجرام و علم العقاب) لەلاپەرە ٢٧٤ نووسیویەتی:

١_ تیوری شیکردنەوەی دەروونی بە شێوەیەك داڕێژراوە، دەستەواژەکانی نادیارن وەکو (الکبت، التبریر، الاسقاط، التکوین،....) و چەندەها چەمکی ونی تێدایە وەکو دابەش کردنی دینامیکی کەس بۆ (الهو)و (الانا)و (الاعلی)، دابەش کردنی تۆبۆگرافی بۆ دەروون بۆ (شعور)و (ماقبل الشعور) کەوای کردووە تەنیا چەند کەسێکی کەم لەو بوارەدا شارەزایی پەیدا بکەن.

٢_ رێگای چارەسەرکردنی گرفتی رەفتاری تاوانکاری بە شیکردنەوەی دەروونی، پراکتیکی نیە، هەروەها چەندان کەم و کوڕی دیکە کە د. عبود السراج لە سەرچاوەی پێشوو باسی کردووە بۆ زیاتر زانیاری دەتوانرێت سوودی لێوەربگیرێت.

# دەرئەنجام

لە هۆکارە ناوەکیەکانی رەفتاری تاوانکاری زانایان، یەکیان نەگرتووە، بەڵکو لەناو هەربابەتێك چەند بۆ چوونێك هەیە ئەم بۆچوونانەش پاش لێکۆڵینەوەو نامارکردن دەرکەوتووە، ئەم هۆکارانە و زانینیان و زیاتر بۆ پێش چوونی، وا لە کۆمەڵگا دەکات کە بتوانێت کاتێك ئەم هۆکارانە سەرهەڵدەدەن رێ لەسەرهەڵدانی ئەو هۆکارە بگرێت و وای لێنەبێت کەوا بەرەو ئەنجام دانی تاوانی ببات و بەهۆیەوە دەتوانرێت بزاندرێت چۆن رەفتار لەگەڵ منالْ بکرێت، و ئەم هۆکارانە هەر چۆنێك لەرووی سەلماندیان سوودیان دەبێت بۆ زانینی رێگاگرتن لە تەشەنەکردنی تاوان و ساناکردنی کاری نەهێشتنی تاوان بۆیە بایەخ دان بەم هۆکارانەو زیاتر لێکۆڵینەوەکردن کارێکی زۆر باشە.

# پوختە

لێرەدا بۆمان دەردەکەوێت کەوا ڕاوبۆچوونی زانایان و پسپۆڕانی ئەم بوارە لە ڕووی هەر هۆکارێك لە هۆکارەکانی ڕەفتاری تاوانکاری کۆك نی یە و جیاوازیکی زۆر هەیە لەگەڵ ئەوەشدا هۆکارەکانی ڕەفتاری تاوانکاری دەرەکی بێت یا ناوەکی پێویستە دراسە بکرێت و هەوڵی بن بڕکردنی ئەو فاکتەرانە بدرێت کەوا کاری ئەم هۆکارانە زیاد دەکات و وا لەکەسانێك دەکات گەورە بێت یا بچووك بەرەو ئەنجام دانی تاوان ببات ئەم کارەش تەنها کاری خێزان نی یە ئەگەر دەورێکی بالأشی هەبێت بەڵکو پێویستە هەموو یەکەکانی کۆمەڵگا دەوری خۆیان تێدابببنن و بەشداری لەبن بڕکردنی و کەم کردنەوەی کاریگەری ئەم هۆکارانە بکەن و کۆمەڵگاکەیان دوور بگرن لە ئەنجام دانی تاواندا لەبەر ئەوەی زیانەکەی بۆ هەمووان دەگەڕێتەوە بەهەمان شێوە بوونی وەزارەتێکی تایبەت بەکاروباری کۆمەلأیەتی وەکو زەرورەتێکی ناچارەکی دێتە ئاراوە بۆ ئەوەی ئەم لایەنە وەکو یەکێك لە کارە سەرەکیەکانی بێت و یەکەکانی کۆمەڵگا بەو شێوەیە پێبگەێنیت کەوا خۆیان و منداڵەکانیان لە ئەنجام دانی تاوان بەدوور بگرن لە ڕێگای دانانی بەربەست لەبەردەم تەشەنەکردنی و بەکاریگەر بوونی ئەم هۆکارانە و ڕێنمایی

## سەرچاوەکان


١_ قورئانی پیرۆز.

٢_ قورئانی پیرۆز لەگەڵ وەرگێڕانی بە زمانی کوردی _ مامۆستا محمد ساڵح ابراهیم.

٣_ علم الاجرام وعلم العقاب، دکتور عبود السراج _ چاپی سێیەم ١٩٨٥.

٤_ اصول علم الاجرام، د. محمد شلال حبیب.

٥_ نظریة علم الاجرام، عبدالجبار عریم.

٦_ معجم علم الاجتماع _ ترجمة د. احسان محمد الحسن ١٩٨٠.

٧_ منهاج الاسلام لمكافحة الاجرام _ د. مصطفی ابراهیم الزلمي ١٩٨٦.

٨_ المجرم تكویناً وتقویماً _ رمسس بهنام.

٩_ الموسوعة الفلسفية المختصرة _ نقلها عن الانكليزيه : فؤاد كامل و جلال العشري وعبدالرشيد صادق.

١٠_ اصول علم الاجرام والعقاب _ دکتور رؤوف عبید _ چاپی هەشتەم ١٩٨٩.

١١_ سیكولوجیة المجرم _ د. عبدالرحمن العیسوي _ دار الراتب الجامعیة _ ١٩٩٧.

١٢_ بارەکانی دزی لەلایەن نەوجەوانان لە دادگای نەوجەوانانی هەولێر _ نووسینی بە ئینگلیزی د. نزار محمدامین _ دوای وەرگێڕانی بۆ کوردی لە گۆڤاری تەرازوو ژمارە (٧) بلاَوکراوەتەوە.

## ژياننامەی نووسەر:

_ دەرچووی هەردوو كۆلێژی ئاداب و مافە.

_ سەرنووسەری گۆڤاری دەنگارەیە.

_ نووسەرە لە گۆڤاری تەرازووی یەكێتی ماف پەروەرانی كوردستان.

_ ئەندامی كارای سەندیكای ڕۆژنامە نووسانی كوردستانە.

_ خاوەنی چەندین توێژینەوەو بابەتی یاسایییە لە ڕۆژنامەو گۆڤارەكانی هەرێم بە هەردوو زمانی كوردی و عەرەبی.

## بەرهەمە چاپكراوەكانی نووسەر:

١_ (خەرمانەی یاسا)كە بەیەكەم فەرهەنگی یاسایی(عەرەبی_ كوردی) دادەنرێت كە لە پیتی ئەلفەوە تا یاء لەخۆ بگرێت چاپی یەكەم ١٩٩٨.

٢_ (هەرێمی كوردستان بڕیاری فیدراڵیو نەبوونی دەستوور) ١٩٩٨.

٣_ (نووسەر لە نێوان ئازادی ڕادەربڕین و پابەندبوون بە یاسادا) چاپی یەكەم _ ١٩٩٩.

٤_ (نووسەر لەنێوان ئازادی ڕادەبڕین و پابەندبوون بە یاسادا) _ چاپی دووەم _١٩٩٩.

٥_ (خەرمانەی یاسا) _ چاپی دووەم _ ١٩٩٩.

# نــــــاوەرۆك

